


## مەلا کاکە حەمەی بێلوو

١٢٥٣ هەتاوی ١٣٢٣ هەتاوی



کۆکردنەوە و ساغ کردنەوە و لە سەر نووسین و پێشەکی کاکەی فەللاح

ئەی خاکی وەتەن بۆچی نەما شێوەیی پارت؟
بۆ بوو بە شەوی زوڵمەت و تاریکە نەهارت!؟
بۆ باسی نەما دەفتەری ئەحکامی ئیلاهی!؟
بۆ یادی خودا وا لە گورێزا لە کەنارت!؟

# دیوان ناری

مەلا کاکە حەمەی بێلوو
١٩٤٤ - ١٨٧٤

کۆکردنەوە و ساغ کردنەوە و
لە سەر نووسین و پێشەکی
کاکەی فەللاح

ژێرنووسە فارسیەکان کاک حەمیدی موستەعان نووسیویەتی

ناری، محمد ۱۲۵۱ـ ۱۳۲۲.
دیوان ناری/ مولف ناری؛ شرح لغات به فاسی حمید مستعان؛ برگردان نوشتاری لغات به رونوشت کردی ستاره خامسی. ـ سنندج: حمید مستعان، ۱۳۸۲. ۲۲۳ص.
ISBN 964 06 1112 - 3: ٤۰۰۰ ریال
فهرست نویسی بر اساس اطلاعات فیپا.
کردی.
۱.شعرمریوانی. ۲. شعر کردی. ـ ایران ـ قرن ١٤. الف. مستعان، حمید، ۱۳۵۳ ـ گردآورنده ب. ستاره خامسی ، طیب. ج. عنوان.
PIR۳۲٥٦/م٤۳۳ن۲ ۸فا۹/۲۱
۱۳۸۲ د٤۹۱ن
۱۳۸۲
کتابخانه ملی ایران ۸۲ـ۱۹۰٤٤م

ناوەندی بلاو کردنەوە:
سنندج پاساژ عزتی انتشارات کردستان ☎ ۲۲۶۵۳۸۲

# دیوان ناری

هونراوەی: ناری ❁ کو کردنەوەو راست کردنەوەی : کاکەی فلاح
چاپی یەکەم: ۱۳۸۳ ❁ تیراژ: ۲۰۰۰ بەرگ
حروفچینی: ئاشنا ❁ ناشر: کتابفروشی نور (حمید مستعان)

| شابک: ۳ ـ ۱۱۱۲ ـ ۰۶ ـ ۹۶۴<br>ISBN: 964 - 06 - 1112 - 3 | نرخی<br>۱۰۰۰ تمەنە |
|---|---|

بسم اللّه الرحمن الرحيم

## پێشەکی
## دەربارەی بەرهەمی کلاسیکی

کاکەی فەللاح

پێم‌وایە هەموومان دەیزانین کە وشەی کلاسیزم لە وشەی کلاسی لاتینیەوە هاتووە کە یەکێک لە ماناکانی (پارچەیەک لە کەشتی) دەگرێتەوە. بەڵام ئاخۆ تەنها هەر یەک مانای هەیە، یان بۆ کۆمەڵێک شت و مەبەستی‌تر بە کار دێت. وەک کۆمەڵێک کەشتی، کۆمەڵێک قوتابی، پۆلێک، ئەوکۆمەڵەکەسەش کە چینێکی کۆمەڵ دروست بکەن. هەروەها وەک زاراوەیەکی تایبەتی بۆ ئەو ئەدەبی کۆنی ئەغریقی و لاتینیەش بە کار هات کە لە پۆلدا دەخوێندرا، پێم وایە هیچ گومانیش لەوەدا نی‌یە کە ئەم ئەدەبە ئەدەبێکی دامەزراوو چەسپاوو پەسەند کراوی ئەوتۆ بوو کە دەستی رۆژگار نەیتوانیبوو بیمرێنێ و نرخ و بایەخی زیندووی خۆی هەر مابوو، وەک چەن دەقێکی رەسەن و لێ وەشاوە بۆ چەشتن و پەروەردەی نمونەیی ئەدەبی بەکار دەهات و بە قووڵی دەخوێندرا.

بەڵێ راستە و سەرچاوەکانیش زۆرن لەم بارەیەوە، کە سەرەتا سەرهەڵدانەوەی ئەم چەشنە ئەدەبە، وەک بزووتنەوەیەکی بەتەوژم، لە

ئەورووپادا بوو، وردتر بلێین لە ئیتالیا سەری هەڵدا ئەورووپاییەکان کەوتنە ئەوەی خۆیان بە ئەدەبی کۆنی خۆیانەوە نەبەستنەوە و دەست بکەن بە مژینی شیلەو هەلاڵەی بیرو فەلسەفەو داستان و کارەساتی ناو ئەدەبی یۆنانەکان و رۆمانەکان. ئەم بزووتنەوەیە لە سەر دەستی (دانتی) خاوەنی (کۆمیدیای یەزدانی) و بترارک و بوکا شێوە و بنەوانەکەی هەڵگیرا، بەتایبەتی دوای داهێنانی چاپ و بەهۆی دەربەدەر بوونی زاناکانی (بیزنطە) دوای داگیرکردنی (قسطنطینیە) (١٤٥٣) و گیرسانەوەی ئەو زانایانە لە ئیتالیا ئەم بزووتنەوەیە پەرەی سەند و فەرەنساو بەریتانیاو وڵاتەکانی تریشی گرتەوەو بە تەواوی بوو بە پێوانەیەک و زاراوەیەکی تایبەتی بۆ ناسینەوە و جیاکردنەوەی ئەدەبی کۆن و نوێ تا لە سەردەمێکی تازەترا و بە تایبەتی لە سەدەی حەڤدەهەمدا رەخنەگر و لێکۆڵەرەوەکان زاراوەی کلاسیزمی نوێیشیان داهێناو داوایان لە شاعیر و نووسەرەکان دەکرد کە پەیرەوی کۆنینەکان بکەن و لاسایی یۆنانەکان و رۆمانەکان بکەنەوە و بایەخی زۆر بە ژیری و چەسپاوی و هێمنی بدەن... تەنانەت هونەرمەندەکانیش دەستووری زۆر سەخت و گران و قایمیان بۆ شیعر و پەخشان دانا. وەک دەستوور و مەجانەی کە (بوالو) رەخنەگری ناوداری فەرەنسی بۆ شیعر و نووسینی دانا. ئەو شاعیرانە بە سایەی شیعر و دەستوورە سەختەکانیانەوە لە رەشۆکی خەڵکەکە دابڕان و زیاتر بایەخیان بە روخساری بەرهەمی ئەدەبیدا، نەک ناوەرۆک.

## شیعری کلاسیکی کوردی

بەڵێ راستە پێوانەی ئەدەبی کلاسیکی ئەوروپی، دەقاو دەق وەک هەیە، بە هەموو رەگ و ریشە و مەبەست و مانا و پەل هاویشتنی لقو پەلێکەوە، کوت و مت، بەسەر ئەو چەشنە بەرهەمە ئەدەبی‌یانەی کوردیماندا ناگونجێت و تەواو دەرناچێت، ئەویش سەبارەت بە جیاوازی‌ی قووڵ و ئاشکرای نێوان دارو باری ژیان و گۆڕینی کۆمەڵگای ئەوروپی و کوردەواری. بەڵام خۆ ئەمەش مانای ئەوە نی‌یە کە سامان وکەلەپووری سەردەمێکی دوور و درێژی نەتەوەکەمان، نابێ بە پێوانەی زاراوەی کلاسیزمی، یان کلاسیک، بپێورێت.

ئێمە ئەگەر بە وردی سەرنجێکی تابلۆی رەنگین و فراوانی ئەو چەشنە شیعر و ئەدەبەمان بدەین و بە شوێن چەند رەگ و ریشە و مەبەستێکی ئەدەبی کلاسیزمیدا بگەڕێین، ئەوا بە ئاسانی چەند گەوهەر و هەوێنێکی سەرەکی و دیار لە هەردوولادا دەبینین... بەتایبەتی گەوهەر و هەوێنی بابەتی ژیری و بیرو باوەڕی میسالی ئایینی و بایەخدانی تەواو بەروخسار و وشە دەربڕین لە سەر حسابی ناوەرۆک و بەو نەریت و دەستوورە گران و سەختانەوە کە شاعیرانی کلاسیکی کوردی پەیڕەوی‌یان کردووە و چەشنە دابڕان و تێنەگەیشتنی بەرهەمەکانیان لە لایەن گشتەوە و مۆرکی ئەو ئەدەبەیە (ئەدەبی تایبەتی)... لێرە بە دواوە، وەک چەند خاڵێکی سەرەکی بە قەڵەمێکی درشت، بۆ دەست نیشان کردن و جیا کردنەوەی شیعری

کلاسیکی کوردی و ئەو رواڵەتانەی تایبەتین بەم چەشنە بەرهەمە ئەدەبی‌یانەوە دەخەمە بەرچاوی خوێنەرانی بەڕێز.

## نیشانەکانی شیعری کلاسیکی کوردی

وەک لە ناوەرۆکی قسەکانی سەرەوەماندا دەرکەوت چەند دەستوور و بایەخ و نرخێکی تایبەتی و نەگۆڕ هەیە کە بوونەتە هەوێنی مەیاندن و خەمڵاندن و گەشەپێدانی بەرهەمی شیعری کلاسیکی کوردیمان، ئەم خاڵانەی لای خوارەوە، بەلای منەوە، سنوورێک و چوارچێوەیەک بۆ ئەو وڵاتی شیعرانە دادەنێن:

١ـ غەزەل و قەسیدەی کلاسیکی کوردی بە شێوەیەکی ستوونی ـ عەموودی ـ هاتۆتە خوارەوە، بە پێی دەستوور و نەریتی قافیەی یەکگرتوو، کە زنجیر و کۆتێکی سەخت و گران بووە بۆ دەست و قەڵەم و مێشکی شاعیرانی کورد و ئەم شێوەیە زۆربەی هەرەزۆری بەرهەمی شیعری کلاسیکی کوردی گرتۆتەوە.

٢ـ لە رووی کێشەوە، لە ئاسۆی شیعری فارسی و لە ژێر زەبری ئایینی ئیسلامدا، زۆر لە شاعیرە کلاسیکە کوردەکان، پەیڕەوی کێشی عەروزی عەرەبی‌یان کردووە... ئەم کێشە عەروزە، وەنەبێ کێشێکی تایبەتی سەر بە ئایینی ئیسلام بێت، بەڵکوو شاعیرە عەرەبەکانی دەوری جاهیلی پێش ئیسلام بەم کێشانە شیعریان وتووە و دانـاوە و ئەحمەدی خەلیلی فەراهیدیش ئەو کێشانەی لە شیعرەکان خۆیاندا دۆزیوەتەوە و وەک پێوانەیەکی کێش و ئاوازی بۆ شیعری عەرەبی

بۆوەتە باو، شاعیری گەلەکانی وەک فارس و کورد و تورکیش، دوای موسڵمان بوون، وازیان لە کێشە تایبەتی‌یە نەتەوایەتی‌یەکانی خۆیان هێناوە و، وەک شتێکی ئایینی و پیرۆز، لە بەرهەمی شیعری خۆیاندا، کێشی عەروزی عەرەبی‌یان، ئەوەندەی پێزوو هێزی زمانەکانیان ماوەیان بدات، بەکاریان هێناوە... نەک هەر ئەوەندەش، بەڵکوو خوێندنی کێشی عەروز، بە هەموو دەریا و لقەکانی‌یەوە یەکێک بووە لە دەرسە بایەخدارەکانی فەقێ و مەلاکانی هەموو قوتابخانە ئایینی‌یەکانی مزگەوتەکانی کوردستان.

بەلای ئەو شاعیرانەی کە بە کێشی عەروز (عروض) شیعریان وتووە شیعری راستەقینە ئەو شیعرەیە کە لە سەر کێشی عەروزی عەرەبی بێت. شاعیری تەواو سەرکەوتووش ئەو شاعیرەیە کە زۆر لە کێشە عەروزەکانی بەکار هێناوە.

٣ـ بەلای تێکڕای شاعیرانی کلاسیکەوە وەک قاڵب و چوارچێوەی شیعر، غەزەل و قەسیدە و چوارین و تاک و پێنج خشتەکی و مولەممەع و تەرجیع بەند و موعەمما هەیە و هەبووە... وایان داناوە، وەک شتێکی نەگۆڕ و لەسەری رێک کەوتوو، کە ژمارەی بەیتی غەزەل نابێ لە حەوت بەیت زیاتر بیت و دەبێ هەمیشەش تاک بێت... ئەگەر لە حەوت بەیتیش کەمتر بوو رەخنەی لە سەر نی‌یە. ئەگەر خۆ هەر شیعرێکیش لە حەوت بەیت زیاتر بوو ئەوا دەچێتە ریزی قەسیدەوە. ئەم قاعیدەیەش لە هەموو دیوان و بەرهەمە شیعری‌یەکاندا پەیڕەوی کراوە... ئەگەرچی مەفهوومی غەزەلیش یان هەمووی هەر بۆ دڵداری‌یە... قەسیدەش بۆ

کاروباری شیوەن و یاد و پیا هەڵدان و شەڕ و شۆڕ و بابەی مێژوویی و کۆمەڵایەتی و ئایینی و وەڵام و نامە و ئەم چەشنە بابەتانەیە...

٤ـ شیعری کلاسیکی کوردی کەمتر، هەر زۆر کەمتر، پەیڕەوی یەکێتی بابەتی کردووە و دەکات. تێکڕا بەیتەکان چەشنە سەربەخۆییەکی واتایان پێ ڕەوا بینراوە... غەزەلی وا هەیە حەوت بەیتە، بەیتی یەکەمی دڵدارییە، دووەمی باسی بێوەفایی چەرخ و دنیایە و، بەیتی سێیەمی شاعیر سکاڵا لە دەست نەفسی ئەممارەی خۆی دەکات، چوارەم بەیت پاڕانەوە و نزایە بۆ خوا، پێنجەم بەیت ترسی مردن و باسی قەبر و قیامەتە... هتد. ئەم دیاردەیەش لەوەوە هاتووە کە شاعیر جۆرە سەربەستییەکی داوە بە خۆی، بۆ خۆ دەرباز کردن لە کۆت و زنجیری کیش و قافیەی یەکگرتوو، بە نیازی ڕازاندناوەی ڕوخساری شیعرەکە لە ڕووی مەعناوە ئەم باز باز بازێنە بکات و هیچ خۆی بە یەکێتی بابەتوە نەبەستێتەوە.

٥ـ دەبینین شاعیری سەرکەوتوو و تەواو بەدەستەڵات، بە پێی پێودانی کلاسیک، بەو شاعیرانە دەڵێن کە دیوانی شیعرەکانیان لە هەموو پیتێکی هیجایی، وەک قافیە، تیابێت. ئەمەش مانای ئەوەیە ئەو شاعیرە هونەرمەندە تەواو بە سەر وشە و زمان و بەکار هێنانی قافیە جیاوازەکانی سەربە هەموو پیتە هیجاکاندا زاڵە، سەلیقە و بەهرەی شاعیرانەی بە چەشنێک سەرکەوتووە کە بەرامبەر بە هیچ وشەیەکی ڕەق و سەختی قافیەدا نامێنێ و پەکی ناکەوێت... بۆ نموونە ئەگەر شاعیرێکی گەورەی وەکوو (مەحوی) بیەوێ لە پیتی (ث)دا بۆ قافیە

شـیعری هـەبێت، ئـەوا پـەنای بـردۆتە بـەر (بـاث) کـە لە بـەحثی عەرەبیی‌یەوە وەری گرتووە، هیچ نەیخستۆتە سەر باری شێوەی قسـە پێ‌کردنی کوردی کە (باس) بەکار ئەهێنێت نەک (باث).

٦ـ بەکار هێنانی وشەی عەرەبی و فارسی، وەک دوو سەرچاوەی سەرەکی رۆشنبیری و کار لێ‌کردوو بۆ سەر زمانی کوردی، بـە لای شاعیری کلاسیکەوە، نەک هەر دیاردەیەکی لاواز و بـێ دەرەتـان و گوشراو نەبووە، بەڵکوو نیشانەیەکە لە نیشانەکانی رۆشنبیری شاعیری کورد و زانینی زمانی بێگانە و نەخشاندنی باخچەی شیعرەکانیان بەو وشە زۆرو زەق زەق و دیارانـەی کـە لە رادە بـە دەر ئـاوێتەی وشـە کوردی‌یەکانی ناو شیعرەکانیان کردووە و بە حسابی خۆیان و باری سەردەم بەرهەمەکانیان پێ نەخشاندووە. ئاشکرایە زمانی کوردی، لە بیستەکانەوە و بە تایبەت‌تر لە سیەکان و دەرچوونی جووتە گۆڤارە بە نـرخ و تـاقانەکـەی یـادگاری لاوان و دیـاری لاوان و لە گـۆڤاری (گەلاوێژی پرشنگدارەوە کەوتە خزمەتێکی پوخت و بژارو داهێنان و دانانی وشە و دەربڕین و زاراوەی پێویست و پڕ بە پێستی مەبەست... لە سەردەمی نالی و سالم و کوردی‌دا، کە سەرەتای سەردەمی شیعر بـە زمانی کوردی کوردستانی خواروو بوو لە ناوچەی باباندا، شاعیرەکان پـەروەردەکـراوی زمـان و رۆشـنبیری عـەرەبی، فـارسی بـوون، لە سەردەمێکدا کە بە کوردی نووسین وەک نەنگ و نـاتەواوی دەدرایـە قەڵەم و پێ‌نووسینی مایەی چەشنە ئازایەتی و دەرباز بـوون و تـێپەڕ بوون و چاو قایمیەک بوو، لە حاڵەتێکی وادا چۆن وشەی فـارسی و

عـەرەبی، کـە ئـەمەی دوایـیان زمـانی قـورئان و حـەدیس و بـابەتە ئایینیەکەی ئیسلام بوو، هەر بە خەروار ناکەوێتە ناو زمان و شیعری کوردی‌یەوە؟!... شان بە شانی خزمەت کردنی زمانی کوردی، وشەی عەرەبی و فارسی بەرە بەرە لە شیعری کلاسیکی کوردی‌دا تا دەهات کەمتر دەبووەوە.

٧ـ سنعەتی وشە ئارایی و تێکڕا کاروباری رەوانبێژی بەتایبەتی لە مەیدانی رەگەز دۆزی و لەف و نەشر و تەوریە و هێنان و بردنی وشە و گووشینی تا رادەی وشکەوە کردن، سیمایەکی ئاشکرا و دیاردەیەکی زەقی شیعری کلاسیکی کوردی‌یە... هەر شاعیرێک توانیبێتی لە رووی سنعەتکاری و شارەزایی زمان و بەکار هێنانی بۆ چەند مـەبەستێکی وشە و ماعنا و مەبەستەکانی‌یەوە، گەردان بە وشەکان بکات، ئەوا بە پێوانەی ئـەوە بـە شـاعیرێکی سـەلیقەدار و سـنعەتکار و بـەهرەدار دادەنرێت.

٨ـ فەرهەنگی تایبەتی سەربە وشەکانی شیعری کلاسیکی کوردی فەرهەنگێکی دەوڵەمەند و فراوانە و وەک سەرچاوەیەکی زمان و زاراوە و دەربڕین هەموو یەکـیکیان بـە پـێی تـوانـا و پـێویست و کـەرەسە زەخیرەی لێ وەرگرتووە و بۆ مەبەستی شاعیرانەی خۆی بـە کـاری هێناوە. بـە تـایبەتی لە ئـاقاری لێ‌چـووندا، لەم فـەرهەنگەدا، تـێکڕا هەموویان لە سەر ئەوە رێک کەوتوون کە بۆ نـموونە: چـاو نـێرگسە؛ برژانگ تیرە، برۆ کەوانە، روومەت گوڵە، لێـو خونچەیان لەعلە، خاڵ قووڵە رەش و حەبەش زادەیە، زوڵـف کـافریان شـەوە زەنگـە، پـرچ

رەشمارە، دەم زەمزەمە، باڵا سەروە... هتد. ئەم لێچوونانە بە چەشنێک رەگیان داکوتاوە و باو بوون کە هیچ شاعیرێکیان خۆیان لێ یان لانەداوە و تەنها چەشنی دەربڕینی ئەم شاعیر لەگەڵ ئەو شاعیردا جیاوازی هەیە.

٩ـ موبالەغە، زیادەرەوی و بەرز فڕین، سیمایەکی دیار و ئاشکرای شیعری کلاسیکی کوردیمانە. ئەم دیاردەیە لە بەرهەمی شاعیرەکاندا بە روونی دەردەکەوێت.

بۆ نموونە (سالم) دەڵێت:

گیان ئەدەم ئەمساڵ بە نرخی ماچێکی دوو ساڵی تر

قەت بە مەشروتی سەلەم لەم بەیعەشا سەودا نەبوو

(نالی) دەڵێت:

لە خەوفی تەلعەتت رۆژ هەر وەکوو شێت

بەروو زەردی هەڵات و کەوتە کێوان

تەنانەت ئەوەندەیان حەز لە موبالەغە کردووە، زۆر جاری وابووە دەمی دولبەریان بە نوقتەیەکی زۆر خەیاڵی و بچووک داناوە کە بە زەحمەت دەبینرێت. یان بەژنی دولبەرەکەیان ئەوەندە بە باریکی پێ جوان و خۆ شبووە کە بە باریکی موویان چواندووە، وەک:

خوایە گەر کوێرم دەکەی (قەد موو) لە چاوم دەرنەکەی

١٠ـ شانازی کردنی شاعیر بە خۆیەوە... ئەگەر دیوانی چاپکراوی شاعیرە کلاسیکی یەکان تەماشا بکەین، دەبینین هەموو یەکێکیان، کەم و زۆر، ئەم گیان و هەستی شانازی کردنەیان بە خەستی تیایە، ئەمەش

بێ‌گومان لە خۆیەوە نەهاتووە و ڕەگ و ریشەکەی، ئەگەر بە هەڵەدا نەچم، لە سەرێکەوە بۆ متمانە و باوەڕی شاعیر بە خۆی و لە سەرێکی تریشەوە، لەو سەردەمانەدا هیچ دەرفەت و دەرەتانێکی بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن و لە سەر نووسین و هەڵسەنگاندن نەبووە، شاعیر ناچار بووە بە دەمی خۆی ئەو ئەرکە ببینێت وەک:

فارس و کورد و عەرەب هەرسێم بە دەفتەر گرتووە

(نالی) ئەمڕۆ حاکمی سێ مولکە دیوانی هەیە

کە شیرین و تەڕی دی شیعرەکانم

وتی: (مەحوی) کە میراوی فوراتی

١١ـ پێداهەڵدان: ئەم بابەتە، وەک ناوەرۆک، لە زۆربەی زۆری شیعرە کلاسیکی‌یەکاندا بەرچاو دەکەوێت و هەیە... پێداهەڵدراو وەک قارەمانی کردەوەیەکی دیار و دەرکەوتوو، ئیتر ئەوکردەوەیە لە مەیدانی شەخسیدا بێت، یان لە مەیدانی بزووتنەوەیەکی نەتەوایەتی، نیشتمانی، ئایینی، زانستی، ئەدەبی... هتد. شیخ ڕەزای تاڵەبانی بۆ ئەم بابەتە و بابەتی دواتر کە داشۆرین (هەجو)ە یەکێکە لەو شاعیرە هەرەزۆر کەم و دانستە و بلیمەتانەی کە داهێنەرێکی خوڵقێنەر و هەر تەواو هەڵکەوتوو. وەک:

خزمینە مەدەن پەنجە لەگەڵ عەشرەتی جافا

مێرووله نەچێ چاکە بە گژ قوللەیی قافا

یان بۆ بابانەکان:

هەرچەند بە مەسەل خەنجەری ئەڵماسە زمـانم

نابڕێ سەری موویە لە ئەدای شوکری نیعەمتان

یان (ناری) بۆ شێخ مەحموودی حەفید:

کە من غەرقی زرێباری غەمی تـۆ بـم لە (بـێلوو)دا

لە ناڵە و شیوەن و دەرد و غەمی ئەغیار و یارم چـی

بڵێ (ناری) لە کونجی میحنەت و غەمدا هەتا ماوی

بەبێ بازی (فەرەح) ئاخر لە سەیران و شکارم چـی

١٢ـ داشۆرین: ئەم بابەتەش، وەک پێچەوانەی دیوی پـیاهەڵدان، بابەتێکی تری شیعری کلاسیکی کوردیمانە و کەم و زۆر لە بەرهەمی شاعیرەکاندا هەیە... بەڵام وەک دەزانین تا ئێستە هیچ شاعیرێکمان، لەم بارەیەوە، بە تۆزی پێی شێخ رەزای بۆ هەجو خوڵقاو نـەگـەیشتووە، وەک:

لە سەگم پرسی عەجەب قەومتە حوسنی پاشا

تووڕە بوو، کلکی لەقان و وتی: حاشا، حـاشا

راستی گەرچی سەگیشم، بەخوا خۆم دەکوژم

ناوی من بێنی لەگەڵ ئیسمی خـەبیسی پـاشا

١٣ـ شێوەی ماتەم و دیاری کردنی کۆچی خۆشەویست و لە دایک بوون بە حسـابی ئـەبجەد لە شـیعردا بـابەتێکی ئـاشکرای شـیعری کلاسیکیمانە. لەم مەیدانەشدا (بـێخود)ی شـاعیر سـوارچـاکـێکی چابوک و بە دەستەڵات و لێهاتووی ئەم بابەتەیە.

١٤ـ دارشتنی پتەوو تەواو بەهێز. لەسەر ئەو بناغەیەی کە شاعیران

و رەخنەوان و لێکۆڵەرەوانی شیعر و ئەدەبیات شێوەی داڕشتنیان بەسەر سێ چەشن، یان ڕێباز و قوتابخانەدا، دابەش کردووە:

١ـ داڕشتنی (سەبک) خوراسانی.

٢ـ داڕشتنی عیراقی.

٣ـ داڕشتنی هیندی.

ئەم شێوەی دوایییەیان لە هەموویان سەختتر و گرانترە... (مەحوی) شاعیر پەیڕەوی ئەم چەشنە داڕشتنەی کردووە، بۆیە هەر لە کۆنەوە تا ئێستا شیعرەکانی بەوە ناسراوە کە رەق و داخراون. شاعیرانی تری شیعری کلاسیکیمان پەیڕەوی دوو چەشنە داڕشتنە کەیان کردووە.

١٥ـ شاعیری کلاسیک، وەک پاسایەکی شیعر دانان لە دوابەیتی هەموو غەزەل و قەسیدەیەکەوە، لەقەبی خۆی داناوە و پێش دەست کردن بە شیعر ناسناوێکی گونجاوی بۆ خۆی داناوە و بۆ مەبەستی ناسینەوەی شیعرەکانی بەکاری هێناوە. بێ گومان ئەم پەیڕەوەش سوودی تەواوی خۆی هەبووە لە سەردەمێکدا کە دەرەتانی بڵاو کردنەوە و راگەیاندنی وەک گۆڤار و رۆژنامە و رادیۆ و تەلەفزیۆن و چاپ و چاپەمەنی لە ئارادا نەبوون. ئەگەر ئەم لەقەب بەکارهێنانەش نەبوایە ئەوا بەرهەمی زۆر شاعیرانمان تێکەڵاو یەکتری دەبوون و سەرئێشە و سەرلێشێوانێکی قووڵ و بێ پایانی بۆ دروست دەکردین.

١٦ـ شیعری کلاسیکی، بابەتێکی گشتی و خۆراکێکی زۆربەی ئەو خەڵکە نەبووە، لە رادەی تێگەیشتن و چێژ لێوەرگرتنی بەتایبەتی

مرۆڤی جاران، دوور بووه و به شیعر و ئەدەبیاتی تایبەتی پیاوه خوێندەوار و رۆشنبیره دیوان نشینەکانی ئەوسای توێژی سەرەوەی کۆمەڵ دەناسرا. تەنانەت، بەبڕوای من. زاراوەی دیوانی شیعریش هەر لەم تایبەتیی دیوان نشین و چەشنە رۆشنبیره تایبەتی‌یانەوه پەیدا بووه. ئەمانە بوون سیما و پێناسەی شیعری کلاسیکی کوردیمان.

قوتابخانه ئەدەبی‌یەکان

زانستی ئەدەب و مێژووی رەخنه و لێکۆڵینەوه، له هەموو جیهاندا، ئەو راستی‌یەی روون و یەکالا کردۆتەوه، کەسێ قوتابخانەی سەرەکی له ئەدەبدا هەیه:

١ـ قوتابخانەی کلاسیکی، که مۆرکی بنەڕەتی جیا کردنەوه و ناسینەوەی بەوەیه که زۆرتر رەگەزی ژیری به سەریدا زاڵه و به پێی چەند دەستوور و پەیڕەوێکی سەخت و گران دانراوه.

٢ـ قوتابخانەی رۆمانسی: زۆرتر سۆز (عاتیفه)ی گرتۆته خۆی و باوەشی بۆ سروشت گرتۆتەوه و له شەققەی باڵی خەیاڵ و ئەندێشەی داوه و شاعیر خوودی خۆی مەبەسته.

٣ـ قوتابخانەی ریالیزمی: به بەرهەمی ئەو چەشنه ئەدەبه دەڵێن که رووی کردۆته ناو کۆمەڵ و له گیروگرفتەکانی دەدوێت و چارەسەریان بۆ دەدۆزێتەوه. لەم سێ بناوانه سەرەکی‌یەوه دەیان جۆگەلەی رێباز و شەپۆل و تەوژم دروست بوون و دروست دەبن.

ئێستاش له بەر رۆشنایی ئەم سەرەتا و بنچینانەدا روو دەکەینه

(ناری) و گوڵزارە رەنگینەکانی شیعرە بەرزەکانی مەلا کاکە حەمەی بێلوو (ناری) و گەشتێکی ورد و فێنک و لە سەرخۆ بەو باخچە دڵگیرەدا دەکەین و بین دەنێین بە سەرچاوەگەش و تاسەشکێن و رەسەنەکەی شیعری تەڕ و پاراوی کوردیمانەوە و ماوەیەکی باش لەگەڵ شاعیری هەڵکەوتوومان (ناری) بەسەر دەبەین و بەشێک لە تینوویێتی و تامەزرۆیی خۆمان دەشکێنین. بەڵام پێش ئەوەی روو بکەینە باخچەی شیعرەکانی سەرپۆتیکی کورت دەربارەی ئەم شاعیرەمان دەدوێین و باس دەکەین و شتێک لە مافی رەوای خۆی پێ دەبەخشینەوە.

## ناری کێیە؟

(ناری) یەکێکە لە لووتکە بەرز و دیارەکانی جیهانی شیعری کلاسیکی کوردیمان و راستەوخۆ دوای دامەزراندن و چەسپاندنی قوتابخانەی شیعری کلاسیکی ناوچەی بابان لە لایەن نالی و سالم و کوردی و مەحوییەوە، بە یەکێک لە دەنگە زوڵاڵ و رەسەنەکانی ئەو رێباز و قوتابخانەیە دادەنرێت و بە بەرهەمە رەنگینەکانی ئەو سامانە پیرۆزەی نەتەوەکەمانی گەشەدارتر کردووە... ئەگەر بێتوو بە وردی سەرنج لەو بەرهەمە شیعرییانەی بدەین، لە رووی دارشتن و کێش و زمان و دەربڕین و بەهرەی وشە ئارایی و هەموو لق و پەلەکانی درەختی بەلاغەتەوە بە ئاسانی دەگەینە ئەو قەناعەتەی کە (ناری)یش بڵێسەیەکە لەو بڵێسانە و لە رازاندنەوەی شان و شکۆی پڕ لە شانازی مێژووی

شیعری کلاسیکیماندا دەست و پەنجە و قەڵەمێکی تەواو بەهرەدار و بە برشتی هەبووە لە رووی ناوەرۆکەوە، وەک زۆربەی تەواوی ئەو بابەتە شیعرانە، لە بارەی دڵداری و ستایش و کاروباری ئایینی و سکاڵاکردن لە دەست چەرخ و غەم و پەژارە و دەروون و جار جار مەسەلەی کۆمەڵایەتی و نیشتمانی و نەتەوایەتی و... هتد بە کێش و هەناسەکانی عەرووز و فەرهەنگی تایبەتی سەر بە وشە و دەربڕینە باوەکانی ئەو سەردەمانە، بە شێوەیەکی تەواو دیار و ئاشکرا بە دیوانی رازاوەی شیعرەکانی ئەم شاعیرەمانەوە دەدرەوشێنەوە، بە چەشنێک شاعیرێکی گەورە و بە توان و تەمەن درێژی وەک عەلی کەمال باپیر [کەمالی] دەربارەی (ناری) بڵێت:

بە یادی تەبعی شەککەرباری (ناری) تووتی‌ی تەبعم

غەزەلخوانە (کەمالی) بۆیە وا شیرینە ئەشعارم

بێ‌ئەدەب نابم لە لام وایە ئەگەر بێتوو بڵێم

ئەی (کەمالی) شیعرەکانی من لە هی (ناری) ئەکا

وەک لە ئەنجامی کنە و پشکنین و سۆراخ کردنێکی پشوودار و دوور و درێژدا بۆمان دەرکەوتووە لەم شاعیرە هەڵکەوتووەمان بەرهەمی شیعری زۆر بووە، بە راست و چەپ و لە هەموو بۆنەو دەرفەتێکدا و بۆ بچووکترین شت شیعرێک یان چوارینێک یان بەیتێکی داناوە و خەڵکیش لەم دیوو لەو دیوو، بە تایبەتی مەلا و فەقێ کان و شێخەکانی سلێمانی و تەوێڵە و بیارە، لە سەروو هەموویانەوە شێخ مەحموودی حەفید، زۆر عاشقی شیعرەکانی بوون

و بە تایبەتی داوای شیعری‌یان لیّ کردووە و بۆ شیعر جاری وا بووە هەراسانیان کردووە... بۆیە بە دڵنیایی و بە داخەوە دەڵێم ئەم دیوانـە، دیوانی تەواوی شیعرەکانی (ناری) نـی‌یە و نـابیّ، مـن لەم رووەوە پەیوەندی زۆرم لەگەڵ ئەو کەس و ناوچانەدا کـرد بـۆ دەسکـەوتنی شیعری‌تری ئەم شاعیرەمان، تا ئەنجامی هەموو کـردووکۆشەکـەمان هاتە سەر ئەم دیوانەی کەوا بە شانازی‌یەوە پێشکەش خوێنەرانی کورد و کتێبخانەی کوردی دەکەم.

لە شـــەستەکـــاندا خـــاوەن چـاپخانەیەکـی مـەهاباد بـە نـاوی (سەیدیان)ەوە کۆمەڵە شیعرێکی زۆری (ناری) بـە نـاوی دیـوانـی (ناری)یەوە لە چاپدا، ئەگەر چـاو لەو هـەموو هـەڵەت و پـەڵەت و شێواندن و تیّهەڵکێشە ناشیرینانە بـپۆشین کـە نـاوبراو بـەسەر ئـەو دیوانەی هێناوە و ئێمەش لە دەرفەتی ئەم پێشەکی‌یەدا وەک ئۆباڵێکی سەر ئەستۆمان پەنجەیان بۆ رادەکێشین و دەیانگرین، ئەوا رەنگە ئەو خزمەتەی لە رووی پاراستن و چاپکردنەوە بۆ حساب بکرێت...

بۆ نموونە: ناری لە قەسیدەیەکدا کە بۆ شێخ بابە عەلی حـەفیدی ناردووە لە لاپەڕە ٧٢ و ٧٣ی ئەو دیوانەدا دەڵێت:

شـــاڵی گـــڕژاڵـــی رەواجـــی ســـەندووە
لەم زەمـــانە کـــەس غـەزەل نـاکـاتە بـەر
چـــۆن غـــەزەل ئـەمڕۆ رەواجـێکی نـەما
ئێستە من مـەشغووڵی جـاوم مـوختەسەر

مشتەری گەر بێ لە بەغدا وەک بەڕوو
دەیفرۆشم من بە خورما سەربەسەر
گەر بە نارنج و ترنج و پرتەقاڵ
بیکڕن، نەفعی نەبێ، ناکەن زەرەر
من ئەدیبی کوردم و ناوم نییە
کوردە هەر غافڵ لە ناوو بێ خەبەر
کوردە مەحکوومە لە بۆ تورک و عەجەم
کوردە بێفیکر و خەیاڵ و بێ ئەسەر
کوردە هەر وەک بیدی مەجنوون ماوەتۆ
بێسەر و بێسێبەر و خاڵی لە بەر
کوردە وەک وەحشی لە بۆ چەشتەی تەمەع
خۆی ئەخاتە مۆلەکە و داوی خەتەر
کوردە بێشان و شکۆ ماوەو، نەما
قیمەتی حەتتا وەکوو توورو گەزەر

کەچی ئاغای سەیدیان لە ل ٧٣دا و پاش دانانی وردە داشێکی بچکۆلە و چلکن چوار بەیتی زۆر ناشیرین و گڵاوی خستۆتە سەر ئەو قەسیدەیە، بە پێچەوانەی هەموو چەشنە رەوشت و نەریتێکی بڵاو کردنەوە، پێش هەموویان دەست پاکی، و ئنجا لەگەڵ دوابەیتی ناریدا جووتی کردۆتەوە، بەو نیازەی کە خوێنەر واتێ بگات ئەو چوار بەیتەش هەر هی ناری خۆیەتی.

پێش ئەوەی من سووکە دەمە تەقێیەکی ئەو بەراوردە بکەم، حەز

ئەکەم ئەو چوار بەیتەی سەیدیان بۆ خوێنەر و بۆ مێژووی شیعر و ئەدەبیاتی کوردی، لێرەدا تۆمار بکەم:

کوردە گەر سەوداسەری سەرکەوتنی
سەرکەوی تا دەچی‌یە نێو بورجی قەمەر
با نەمێنێ کورد و دەس بگرن بە یەک
بێنە نێو ئێرانی پڕ فەتح و زەفەر
خۆ بە قوربانی رەزاشاکەن هەموو
پادشاهێکە رەشید و دادگەر
تا شکستی پێ بدات و هەڵبڕێ
دوژمنی کوردی هەتا موڵکی تەتەر

ئینجا ناری دەڵێت:

بێ وجوودی موستەمیع لەم عەسرەدا
(ناریا) تا کەی چەناکەی بێ سەمەر

بۆ سەلماندنی ئەوەی کە ئەو چوار بەیتە ئاوەکی‌یە هی (ناری) نی‌یە دەڵێم:

١ـ شاعیرێک ئەو هەموو پەرۆش و سۆزی بۆ نەتەوەکەی هەبێت و بەو چەشنە خەمخۆری کورد بێت، هەرگیز ئەوەی لێ ناوەشێتەوە بڵێت: با نەمێنێ کورد و...

٢ـ ئەو سکاڵای لە دەس تورک و تەتەر بووە کە دەستیان بە سەر کوردا گرتووە ئیتر چۆن داوا لە کوردەکان دەکات ژێر دەستەی ئێران بێت؟

٣ـ ئەم قەسیدەیە هی سی‌یەکان و دەوری رەزاشای رەزاگرانە، کەی لەو سەردەمەدا باس و خواستی چوونە مانگ و بورجی قەمەر بووە کە لە پەنجاکان و شەستەکاندا هاتە کایەوە.

٤ـ لە بەیتی دووەمدا کورد نەمێنێ، کەچی لە بەیتی چوارەمدا، دوژمنی کورد هەڵئەبڕن... چ دوژمنێک لەوە دڕندەترە کە کورد نەهێڵێت؟

یان ئەم هەموو راوە رێوی‌یە و بەوکێش و قافیانەی خۆیەوە، هەر بۆ ئەوەیە (سەیدیان) بڵێت و داوا لە کورد بکات:

خۆ بە قوربانی رەزا شاکەن هەموو

تۆ کەیفی خۆتە چی ئەڵێ‌یت بیڵێ بەڵام بۆ لە دیوانی (ناری) و لە قەسیدەی ئەوا تێ‌هەڵکێشی وا ئەکەی بێ ئەوەی هیچ حسابێک بۆ دادگای سامدار و تۆقینەری شیعر و ئەدەبیاتی کوردی بکەیت.

لە ل ٧٥یشدا (سەیدیان) هەمان تەپڵی لە دوابەیتی دەسکردی خۆیدا لێداوەتەوە. لە ل ١٨یشدا سێ بەیتی (ناری) دەست کەوتووە کە دەڵێت:

جەژنە لە هەموو لا بەیەقین یاری‌یە ئیمڕۆ
رۆژی تەرەب و عوشرەت و بێداری‌یە ئیمڕۆ
جێگەی فەرەح و شادی‌و ئازادی‌یە بێ‌شک
وەعدەی کەرەم و مەرحەمەتی باری‌یە ئیمڕۆ
پابەندی ئەلەم، هەمدەمی غەم، یاوەری میحنەت

کەچی خێرا بەیتێکی رەزا تاڵی تێهەڵکێش کردووە و دەڵێت:

چۆن تاجی کەیانی لە سەری ناوە رەزاشا

چۆن شەکرە وتەی شا لەگەڵا جاری‌یە ئیمڕۆ

رەحمەت لە پێشینیان کە فەرموویانە: کەر لە کوێ کەوتووە و کوندە لە کوێ دڕاوە. باشە ئەگەر ئەم چەند بەیتە، بە بۆنەی تاج لە سەرنانی رەزا شاوەیە و ئەو بەیتەش وەک سەیدیان دەڵێت هی ناری‌یە بۆچی شاعیر لەو رۆژەدا دەڵێت:

پابەندی ئەلەم، هەمدەمی غەم، یاوەری میحنەت

هەمرازی جەفا، دوور لە سەفا، (ناری) یە ئیمڕۆ

ئەمە ئەگەر وابێت، مانای ئەوەیە کە (ناری) هەوێنی رق و قینێکی زۆر پیرۆز و خەستی بەو بۆنەیەوە بە ئاشکرا تکاندووە.

لە لاپەڕەکانی ١٢٦ و ١٢٩ و ١٣٠یشدا، کەم و زۆر، لەو ژەهرانە رژاون و دەسکاری و تێ هەڵکیش، گەورەیی و پیرۆزی ئەو دیوانە و (ناری)یان شێواندووە.

ئەمە واو مەلا کاکە حەمەی بێلوو (ناری) پیاوێکی ئایینی راست و کورد پەروەرە سۆفی و قەلەندەر مەشرەب و شاعیرێکی هەتا بڵێی‌یت بە بەهرە و نوکتەباز و قسەخوش و مەجلیس گەرمکەر و بەوەفا بوو، هەموو مەیل و خۆشەویستی ئایینی، وەک مەولەوی نەمر، دابوو بە شێخەکانی تەوێڵە و بیارە و بە تەریقەت لە سەر رێگای نەقشی بوو، هەموو مەیل و سۆز و خۆشەویستی نەتەوەکەیش لە شێخ مەحموودی حەفید و ئەو خێزانەدا دەدی... لەم دوو لایەنەوە شیعری زۆری هەیە.

بۆ یەکەمیان کە نیشانەی راستی و وەفا و سۆزی راستەقینەی خۆیەتی دەڵێت:

گەرچی تەقسیری نەهاتن کاری بەندی قاچمە
دەم بەدەم داوێنی پاکت پاکی جێگەی ماچمە
دوور لەتۆ، دایم ئەناڵم، وەک نەخۆشی بێ‌تەبیب
چاوەڕێی ئاوازی دەنگی خاکەناز و پاچمە

کەوا دیارە قاچی باتێی داوە و ناتوانیت سەفەر بکات و زۆر نەخۆشە و چاوەڕوانی دەنگ و ئاوازی خاکەناز و پاچی گۆڕ هەڵکەندنەکەیەتی.

بۆ دووەمیشیان کە شێخ مەحموودی حەفید لە قەسیدەیەکی دوورو درێژدا دەڵێت:

موریدی میحنەت و دەردم، غەمی تۆ پیر و مەولامە
لە مرقەی سۆفی و هاوار و جەزبەی تۆ بەکارم چی
بە پیری دڵ شکستی تەکیەگاهی چۆڵی پیرانم
لە زیکری پیری هەورامان و بەحسی شالیارم چی
کەمن غەرقی زرێباری غەمی تۆبم لە بێلوودا
لە ناڵە و شیوەن و دەرد و غەمی ئەغیار و یارم چی
بڵێ (ناری) لە کونجی میحنەت و غەمدا هەتا ماوی
بەبێ (بازی فەرەح) ئاخر لە سەیران و شکارم چی

ئەو سۆز و ژانانەی لەم قەسیدە بەرزە و لە هاوچەشنەکانیدا هەیە شتێکی شەخسی و پەیوەندی‌یەکی تاکەکەسی نی‌یە لە نێوان شاعیر و

شێخ مەحموودی حەفیدا، بەڵکوو، وەک شێخ رەئووفی حەفیدیش لە نامەیەکدا دەڵێت، ئەنجامی (عەلاقەیەکی رۆحی زۆر بەتینە لە نێوان مەلا کاکە حەمە و باوکی رەحمەتیما) ئەو پەیوەندی‌یەش هەر ئەوەیە کە شاعیر شێخی بەخاوەن مەسەلەیەکی پیرۆز، کە مەسەلەی نەتەوایەتی‌یە، داناوە و لەو روانگەیەوە شیعری بۆ مەیاندووە.

لە مەیدانی شیعری دڵداری و وەک دەڵێن غەزەلیشدا (ناری) کۆمەڵە شیعرێکی هەر تەواو تەڕ و پاراوو بەهرەداری ئەوتۆی داناوە و داهێناوە کە لە رادەی شیعرەکانی (نالی و سالم و کوردی و مەحوی) دابن.

مەیلی غەزەلم ناوەتە (پێ‌چاڵ)ی هەم و غەم
دڵ خاڵی‌یە ئەمڕۆ، چ لە بەیتا، چ لە فەردا
من شکاتی دڵ پەرێشانیم لە گێسووی کردووە
ئەو حەواڵەی مەحکەمەی زوڵفی پەرێشانم ئەکا
بێتە سەر رەوتی کومەیتی بەیتی خۆش تەعلیمی من
هەر کەسێ ئەسپی خەیاڵی فێرە رمبازی ئەکا
چونکە بازاڕی غەزەل ما، بێ رەواج
ئێستە من مەشغوولی جاوم ناعیلاج
کەی دەبێ جەمعیەتی خاتر لە بۆم
تاوجوودم لۆکە بێت و غەم هەلاج
تیری عیشق و چاوی مەستت کوشتمی
ئەی خودا روحمێ لە دەستی جووت و تاق

له مـــولّکی عـــاشقیدا خـوسرەوێکی شـۆخە دڵ، ئـارێ
گەواهی عـیشقە، جـۆش و شـۆڕشی شـیرینی ئـەشعارم
مـــــــوحتاجی دەرم، تـــــالبی دیـــــنار و درەم نـــیم
غـــــــــەمبار و بـــــریندارى دڵـــــی تـــــازە بـــــڕوام
له سەر سـینەی بـەئاهی مـن شکـاچینی سـەری زولفـی
له پـــەرژینی شکـاوی بـاغی سـێوانـی خـوا چـی بکـەم
کە ئاهی سینە وەک جۆشی سـەماوەر بـێ لە جـونبوشدا
لە جێگەی چا، لە دڵدا خوێنی جەرگم دەم نەکەم چ بکەم
دڵم وەک ئاش و دەردم ئـاشەوان و بـۆ مـزەی مـیحنەت
سروشکی دەمدەمی چاوم بە سەیلی چەم نەکەم چـبکەم

[ناری] کە ناسناوی مەلا کاکە حەمەی بێلووە، لە ساڵی ١٨٧٤ز لە دێی (بادڵان) کە سەر بە هەرێمی (گەرمک) و قەزای پێنجوێنە لە دایک بووە. کوڕی مەلا ئەحمەدی کوڕی مـەلا مـوحەممەدی کـوڕی مـەلا عـــەبدولرەحمانە. بـــنەماڵەکـەیان لە دێـی (زیـرهەرمێ) بـوون. بـە دەستووری خوێندنی فەقێیەتی ئەو سەردەمەی کوردستان، لە پێشدا لە لای باوکی قورئان و کتێبە وردەکانی خوێندووە و ئنجا چووە بۆ سنە و بە مەریواندا گەڕاوە و هاتووە بۆ سلێمانی و لە پاشا گەڕاوەتەوە بۆ سنە و پێنجوێن و بانە و وان و باشقەڵا و هەولێر و رەواندز و لە ساڵی (١٩٨٧ز) لە رەواندز ئیجازەی مەلایەتی لە سـەر دەسـتی مـامۆستا ئەسعەد ئەفەندی وەرگرتووە و گـەڕاوەتـەوە بـۆ مـەریوان و لە دێـی (کیکن) چەن ساڵێک مەلا بووە و لە ساڵی ١٩٠٤دا لەسەر داوا کردنی

(حسێن بەگ)ی بێلوو کراوە بە مەلا و مودەڕیسی ئەو دێیە و هەموو ژیانی بە دەرس وتنەوە و مەلایەتی و شیعر وتنەوە بردۆتە سەر و تا لە ساڵی (١٩٤٤)ز لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا کۆچی دوایی کـردووە و لە دێی (بێلوو) نێژراوە.

## دەربارەی (ناری)

شێخ رەئووفی کوڕی شێخ مەحموودی حەفیدزادە لە نامەیەکدا کە بۆی بەجێ هێشتووین دەربارەی (ناری) دەڵێت:

«ناری» زۆر نەفسێکی بـەرزی بـووە بـێجگە لەوەی کـە شـتێکی اسوولی حەقی مەلایەتی لە ئەهلی دێیەکە وەرگرتبێ، خۆی فەلاحەتی هەبووە، هیچ وەختێ نەی ویستووە پـارەیەک، یـان شـتێک لە کـەس وەربگرێت... تایەر بەگی وەسمان پاشا کە ئەدیب و شاعیر بووە زۆر رەفاقەتی (ناری) پێ خۆش بووە، هەرچەندە هاتبێتە (پـێنجوێن) لە هاویندا مەلا کاکە حەمەی دەعوەت کردووە بۆ لای خۆی و مدەتێک گلی داوەتەوە و بە شیعر زۆر موراسەلەیان لە بەیندا هەیە.

(حسین بەگی بێلوو) بۆی گێڕامەوە و وتی: دەفعەیەک (تایەر بەگ) دێی (بالیکەدەر) دەبەخشێ بە مەلا کاکە حەمە (ناری)، ئـەهالیەکـە زۆریان پێ خۆش دەبێ چونکە لە دەس پـیاوەکـانی (تـایەر بـەگ) نەجاتیان بووە و بوون بە رەعیەتی مەلایەکی پیاوچاکی وەکوو (ناری)، دەچن بە شوێنیا و ماڵەکەی بار دەکەن کە نزیک (بالیکەدەر) دەبنەوە هەموو ئەهلی دێیەکە دەچن بە پیریەوە بە خاوو خێزانەوە، مەلا کاکە

حەمەش دەپرسێت: ئەم قەرەباڵغی‌یە چی‌یە؟ دەڵێن ئەهالی دێی (بالیکەدەر) بوون بە رەعیەتی تۆو زۆر مەمنوونن و هاتوون بە پیریتەوە. مەلا دەڵێت: چۆن من بووم بە عەبدی (تایەر بەگ) و فیرعەونی ئەم مەزڵوومانە؟! بناء علیه بە سوورەتی قەتعی ناچم و دەگەڕێمەوە... نە عەبدایەتیم پێ دەکرێت و نەفیرعەونی... هەرچەند ئەهلی دێیەکە دەپاڕێنەوە فائیدەی نابێت، دەگەڕێتەوە (بێلوو) و دێیەکە بۆ (تایەر بەگ) رەت دەکاتەوە.

وەختێ شێخ مەحموودی باوکم لە ساڵی ١٩١٠ (لە دوای کارەساتی مووسل و کوشتنی باوکی روو دەکاتە مەریوان ئەهالی مەریوان بە بەگزادە و رەعیەتەوە هەتا دەتوانن ئیحترامی دەگرن، ئەم ئیحترامە زیاتر لە بەر مەرکەزی دینی کاک ئەحمەدی شێخ و شێخ مارفی باوکی بووە، ئیتر لەو رۆژەوە پەیوەندی‌یەکی زۆر گەورە لە بەینی شێخ مەحموود و مەلا کاکە حەمەدا پەیدا دەبێت، مەلا زۆر شیفتەی ئەو نیشانە دەبێت کە شێخ مەحموود کردوونی. زۆر لە شیعرەکانی لەگەڵ شێخ مەحموودە.

باوکم زۆر جار بۆی گێڕاومەتەوە دەیفەرموو مەلا کاکە حەمە بە قەتعی هیچ نەوعە پارە و مەنفەعەتێکی لێ قبووڵ نەکردووم.

لە ساڵی ١٩٢٧دا کە ئینگلیزەکان شێخ مەحموودیان ناچار کرد لە (پیران) دابنیشێت. زۆر بێ‌دەست کەوت، ناچار هەموو لەشکرەکەی بڵاوە پێ‌کرد. حکوومەتی ئێران تەشکیلاتی لە مەریواندا کرد، لە پاش بەینێک ترسی ئەوە پەیدا بوو ئێران هێز بنێرێتە سەر شێخ مەحموود.

ئیتر مەلاکانی مەریوان کەوتنە خۆیان بە سەرکردایەتی مەلاکاکە حەمە (ناری) و هێزێکی موناسیبی مەریوانیان ناردە شاخی (دۆڵەبە) و (سەردوش)ی پشتی (پیران)، ئەو هێزە بە نۆرە لەوێ مانەوە تا ئەو مەترسی یە رەوی یەوە.

مەلاکاکە حەمە زۆر معجب بووە بە شیعری (حاجی قادری کۆیی).

مامۆستا ئەحمەد خواجە لە بارەی (ناری)یەوە دەڵێت:

کە شێخ مەحموود ناچاری دانیشتن کرا لە مەریوان لە لایەن داگیرکەرە ئینگلیزەکانەوە «سەرەتا لە دێی (ولەژێر) گیرسایەوە» لە لایەن هەموو بەگزادە و مەلا و پیاو ماقووڵانی ناوچەکەوە نامەی بەخێرهاتن و پشتگیری بۆهات، هەموو نامەکان بە فارسی بوون تەنها نامەیەک نەبێت بە کوردی بوو کە ئەویش نامەی (ناری) بوو. شێخ مەحموود فەرمووی: ئەحمەد وەڵامی هەموو نامە فارسی یەکان بە کوردی بدەرەوە و وەڵامی نامەکەی مەلا کاکە حەمە بەفارسی. وتم: قوربان بۆچی؟ وتی: ئەوانەی نامەیان بە فارسی بۆ ناردووم هەموویان کورد و رۆڵەی کوردن ئەمەوێ بەم وەڵامە جنێوێکی ئەدەبی یان پێ بدەم... بۆ مەلا کاکە حەمەش ئەمەوێ تووڕەی بکەم... وتم بەڵێ باشە. دوای یەک دوو رۆژ مەلایەک لەوبەری ماڵەکەمانەوە دەرکەوت کە شێخ چاوی پێ کەوت لە سەر هەیوانەکە راپەڕی و چوو بە پیریەوە دەست و بوسیان کرد و شێخ پێش خۆیدا و کە دانیشتن شێخ وتی: ئەحمەد ئەمە مەلا کاکە حەمەی بێلوو (ناری)یە کە زۆر جار باسی ئەکەم ئینجا رووی کردە مەلاکاکە حەمە و وتی: مامۆستا ئەم ئەحمەدە زۆر نەگریس

و بێ گوێ یە من ئەڵێم وەڵامی مەلا کاکە حەمە بە کوردی بدەرەوە کەچی ئەو بە فارسی وەڵامت ئەداتەوە هەتا توورەت بکات (نـاری)یش لە وەڵامدا وتی: راست ئەکەی ئەگەر بە قسەی تۆ نەکات لای تۆ جـێ نابێتەوە!

مەلا سەعیدی زمناکۆیی پێش نوێژی مزگەوتی بابە عـەلی بـۆی گێڕامەوە وتی: کە فەقی بووم لەگەڵ مامۆستاکەمدا چووینە خزمەت (مەلا کاکە حەمەی بێلوو) مـەجلیس گـەرم بـوو هـەرتاوە نـاتاوێک پیریژنێک دەهات و بە پێوە زۆر چـاک لە (نـاری) ورد دەبـووەوە و دەڕۆیشت منیش لەم کارە زۆر سـەرسام بـووم شـتەکـە سـێ‌بارە و چواربارە بووەوە منیش بە چرپە بە مامۆستاکەمم وت: بزانە نـەهێنی هاتنی ئەو پیریژنە بە مامۆستا کاکە حەمە نادرکێنێ؟ ئەویش وەک من مەراقی بوو کە بە پارێز بۆی چوو لێی پرسی: ئـەوە ئـەو پـیریژنە بـو وائەکات؟ (ناری)یش لە وەڵامدا وتی: وازی لێ بێنن ئەوە خۆی ون کردووە (مەراقەکە زیادی کرد) با بۆتان بگێڕمەوە: چەند ساڵێک لەمەو پێش ئەم پیریژنە هاتە مەجلیسەکەمانەوە هـەر دانـیشت نـاچار لێـم پرسی: خوشکم ئەگەر ئیشێ پرسیارێکت هەیە فەرموو بیڵێ. وتی بەڵێ باشە بەڵام حەز ئەکەم هەر خۆم و خۆت بین دانـیشتوان بـەرە بـەرە چۆڵیان کرد ماینەوە من و ئەو. پێم وت: فەرموو وتی نوورێکی خوایی چۆوەتە دڵمەوە بەرامبەر بە تۆ حەز ئەکەم پاشماوەی ژیانم بۆ خزمەتی تۆ بەسەر بەرم وتم سوپاس کارت راست بێت واپێم گەیشت وتی: من بەوەندە رازی نابم حەز ئەکـەم دەسـتی شـەرعم بـخەیتە سـەر و لە

نزیکەوە خزمەتێکی تەواوت بکەم... مەلا کاکە حەمە وتی: منیش دایکی منالّەکانم نەمابوو بێ خزمەت بووم بەدڵ حەزم لەم کارە دەکرد بەڵام گیروگرفتی خۆم هەبوو بۆیە پێم وت: ئاخر منیش لێت ناشارمەوە حەز ئەکەم ئەو راستی‌یە بزانیت کە من پیاوەتیم نەماوە و هیچ خێرێک لە من نابینیت. کەچی لە وەڵامدا وتی: من بۆ ئەوەی ناکەم تەنها دەمەوێت بە بێ‌تەماع لە نزیکەوە خزمەتی باشت بکەم... وتم: مادەم وایە باشە. چوار پێنج ساڵە هێناومە. لەو وەختەوە ئەمە پیشەیەتی تۆزێک دوور بکەومەوە ئەبێ بێت و بەسەرم بکاتەوە و دڵنیا بێ لەوەی کە هیچ نارەحەتیم نی‌یە ئەمە بەسەرهاتی پیریمە. بابەسەرهاتێکی گەنجیشتان بۆ بگێرمەوە ناخۆش نی‌یە:

کۆمەڵێ فەقی بووین. بۆ (بانە) دەچووین. نزیک (بانە) کانی‌یەکی لێ‌یەلە شوێنێکی ئەوەندە تەختایە هەتا نەچێتە سەرتەوقە سەری کانی‌یەکە نازانی کی لە سەری کانیەکەیە، کەگەیشتینە سەر تەوقەسەری کانی‌یەکە دیمان فریشتەیەک لە سەر کانی‌یەکە خۆی ئەشوات. لە جوانیا وەسف ناکرێ. ئەوقژە ئاوریشمەی بەسەرشان و ملیا شۆڕ کردبووەوە... کە هەستی بە ئێمە کرد لە عەزرەت حەیا و حورمەتی خۆی وەک شێت راپەڕی و ئاگای لە خۆی نەماو بەرەولای ئێمە ملی نا و دەستی گرت بە عەورەتیەوە و قیژانی: بمرن چیشکەی ناکەن. فەقی‌یەکی تامەزرۆی نێرەحەیتەش گورج لە گیرفانی راستی‌یەوە دەستەکێکی ئامادە کراوی دەرهێنا و هاواری کرد: تۆش رۆحت دەرچێ تامی ناکەیت. گەڕاینەوە دواوە.

ئێستەش سەرسامی ئامادەکردنی ئەو دەستەکەم.

مەلاکاکە حەمە دەچێت بۆشاری سنە. لەوێ بازرگانێک بە بۆنەی هاتنی (ناری)یەوە دەعوەتێکی گەورە بۆ چەند مەلا و بازرگانێک دەکات و دەیانەوێ مەلا کاکە حەمە تووڕەکەن بۆیە قسە بە کچە مەریوانی دەڵێن لەو کاتەدا چای بۆ دادەنێن ئەویش هەر زۆر عاشقی (چای) بوو کە تەماشا دەکات چایەکە ساردە ئەویش دەست بەجێ دەزانێ سەماوەرەکە خەفە بووە واتە کونەکانی ژێری بە خۆڵەمێش گیراون و ئاگرەکە خەریکە دەکوژێتەوە بەچیلکە کونەکانی سەماوەرەکە پاک دەکاتەوە دەڵێت: مردووتان مرێ سنەیی سەماوەرەکەشتان وەکوو خۆتان وایە تا لە ژێرەوە پیانەکەی جۆش ناسێنێ و دەماخ پەیدا ناکات.

ماموستا مەلا حەمە ئەمین بۆی گێڕامەوە وتی: تازە ئیجازەی مەلایەتیم وەرگرتبوو چوومە خزمەت مەلا کاکە حەمە ئامۆژگاریەکم بکات، دوای پیرۆزبایی فەرمووی: جاران ئەمانوت «کلموا الناس حسب عقولهم»، ئێستا دەبێ بڵێین: «کلموا الناس حسب جهولهم».

کاک وریا قانیع وتی: باوکم لە خزمەت مەلا کاکە حەمەی بێلوودا خوێندوویەتی و دۆستایەتیان زۆر بەهێز بووە. کە باوکم دەبێ بە مەلای دێی (کاڵ) لە مەریوان، (ناری) سەری لێ دەدات. باوکم دەرامەت و گوزەرانی کەمێک باش بوو، رەنجبەرێکی دەبێ بە ماموستا (ناری) دەڵێت: قوربان ماینت پێ بوو؟ ئەویش لە وەڵاما دەڵێ: بەڵێ ماینم پێیە. رەنجبەرەکەش بۆ ئەوەی بچێ زین لە ماینەکە بگرێتەوە و ئاوی بدات و کاو و جۆی بکا بە سەرەوە دەچێتە دەرەوەی ماڵەکە هەرچەند

دەگەڕێ ماینی بەرچاو ناکەوێت، ناچار دێتەوە بۆ لای ناری و دەڵێت: وا بزانم ماینەکە بەرەڵڵا بووە و هیچ دیار نی‌یە. ئینجا (ناری) بە پێکەنینەوە دەڵێت: رۆڵە ماینم پێ‌یە، یانی بە سواری پێی خۆم هاتووم.

هەرکاک وریا قانیع وتی: لەو سەفەرەدا (ناری) بە باوکمی وت: بەم هاتنەم دڵی دۆست و دوژمنم بە خۆم خۆش کردووە. باوکیشم وتی چۆن؟ ئەویش وتی: ئەوی دۆستە ئەڵێ شکور مەلا کاکە حەمە گوڕی پێ‌ماوە و ئەتوانێ بە پێ سەفەر بکات؟ هەرچی دوژمنیشە ئەڵێ: مەلا کاکە حەمە عومری گەیشتووە بەم عومرە وڵاخێکی نی‌یە بۆ سەفەری ئەملا و ئەولا سواری بێت.

مەلا کاکە حەمە دڵی بەکچێکەوە ئەبێ کە سۆفی ئەوڕەحمان ناوێک و چەند کەسێکی تر خوازبێنی ئەکەن بۆ کوڕە ئاغایەک و سەریش ئەگرێت ئەویش قەسیدەیەکی هەجوویان لێ ئەنووسێت کە هەر ئەم بەیتەیان دەست کەوت:

سۆفی ئەوڕەحمان کە سۆفی بوو لە سێفی ژووروا
کەر بە لەعنەت بێ ئەڵێن پۆشی خەڵاتی پاڵتاو



-١-

سوورەتی یاسین کە وەسفی حەزرەتی لەولا دەکا
ئەهلی دڵ مایل بە جیلوەی[١] سوورەتی تاها دەکا
خاکی بەردەرگاهی قەسری گەر بەسەردا کا، گەدا
هەر نەفەس نەفرەت لە تاجی قەیسەر و دارا دەکا
ئاسمان وەک مشتەری[٢]، هەردەم بە میزانی وەفا
کەسبی هەر شامێ[٣] بە یادی دەوڵەتی ئەسرا دەکا
گەر تەسەوور کا مەسیحی تەختی عەرشی ئەعزەمی
تا ئەبەد تەرکی بەیانی ڕەفعەتی عیسا دەکا
نووری عیشقی تۆ لە سەر توری دڵی موسا مەگەر
دای لە سەر سینەی بە شەوقی دڵ یەدی بەیزا دەکا
بۆ خەلیلان گەر نەسیمی گوڵشەنی لوتفت ببێ
ناری نەمروودی بە سەحنەی (جەننەتولمەئوا) دەکا
تاقی کیسرا بۆ بە بەرقی نوری حوسنی شەق نەبێ!
سەیلی حوکمی ناری فارس زایل و ڕیسوا دەکا
ئەی حەبیبی خالیقی عالەم، لە ئادەم تا بە تۆ
ئەنبیا یەک یەک بەیانی حەزرەتی والا[٤] دەکا

---

(١) جیلوە: خۆدەرخستن و خۆنیشان دان ـ خود را ظاهر کردن.
(٢) مشتەری: ناوی ئەستێرەیە لە ئاسمان، ـ سیّارهٔ مشتری، کڕیار ـ خریدار.
(٣) شام: لێرەدا مەبەست لە وڵاتی شامەو ئیشارەیە بە ئایەتی ـ سبحان الذی اسری بعبده... ـ ژەمی نان خواردنی ئێوارەیە ـ سرزمین شام ـ وعده غذای شب.
(٤) والا: بەرز، خوا ـ بالا ـ خدا ـ.

نێـرگسی مەستی سیاهت[1]، عـەینی (مـازاغ البـصر)
شەمعی بێ‌سایەی وجودت شەرحـی (کـرّمنا) دەکـا
ئادەمی خاکی بەسەر زومـرەی مـەلەکدا بـێ‌گـومان
تۆی سەبەب نازش بە ڕوتبەی ـ علم الأسـما ـ دەکـا
کاشفی (واللیل)ی توڕرەی پەرچەمی شەبڕەنگی تـۆ
ئافتابی[2] تـەلعەتت[3] تـەفسیری (والضـحی) دەکـا
ئایەتی مـیعراجـی پـایەی قـابە قـەوسەینت عـەجەب
وەسفی ئـیعزازت لە تـەختی نـازی (أو أدنـی) دەکـا
عەکسی ئەلفی قـامەتی ئـەبرۆتە گـەر (نـون والقـلم)
سیدقی مەوزونی کەلامت کەشفی (مـا أوحـی) دەکـا
بـا وجـودی پـڕتەوی مـیهری[4] جـەماڵی ئـەنوەرت
کێ خەیاڵـی زیـبی قـەسر و سـایەیی (طـوبی) دەکـا
سەلسەبیلی لوتفی تۆ بێ‌شک لە عـەرسەی مـەحشەرا
توشنەلەب، قانیع، لە بـادەی جـامی (أعـطینا) دەکـا
چی لە دەوڵەت کا، ئەسیری بەندی عیشقی ئەحمەدی
عیشقی مەحموودی بە عاشق کەسبی ئـیستیغنا دەکـا

(١) سیاه: ڕەش ـ مشکی. (٢) ئافتاب: ڕۆژ. خۆر ـ روز، آفتاب.
(٣) تەلعەت: ڕوخسار، مەبەست هـەڵاتنی ڕۆژی ڕووت ـ رُخسـار، (مـقصود طـلوع آفتاب است).
(٤) میهر: بەواتا ڕۆژ (الشمس) دێت. واتە شمسی جەمالی ـ بە معنی آفتاب، خـورشید جمالش.

(نــاریا) وەســفی جــەلالی حــەزرەتی خــیرالبشـر
کەی بەسەد دەفتەر هەتا مەحشەر بەشەر ئینشا دەکـا

* * *

-٢-

چـــونکە هـــەمدەردی ســولەیمانم لە ســیحری دێـوەدا
مـەسڵەحەت وایــە بـڕۆم بــۆ خــۆم بە هـەردو کـێوەدا[١]
هــەرکەسێ گــەر مــەیلی مــەحبوبی بــە دونــیا بـێ دەبـێ
ســەبری وەک مــن بــێ لە بـەر ئـێشی فـەلاقە و چـێوەدا[٢]
مـــاڵی دڵ شـێویێ کــەتاجی عــەشق بـازی نـایە ســەر
وا لە خــــۆی قـــاپی ویـــقار و ئـــیعتیباری پــێوەدا
مــەوعیزە و تــەزویر ئــەی دڵا بـێنەوە سـەر بـەحسی گـوڵ
قـــووتی ڕۆحـــــی بـــــولبولی دڵ وا لە غــونچەی لێــوەدا
مــوعجیزەی حــوسنت نــەبێ، ئـەی ئـافتابی بـێ نـیقاب
ســــوبحی ســـادق کــەی تـلوعیدا لە نــوێژی شـێوەدا
ڕەهــزەنی[٣] فکــرم پــەناگــاهی یــەخەی بگــرێ بـە زۆر
وەهـــمە کـــەس قـابیل نـــیە، دزبــێ، لە بــاغی سـێوەدا
بـــاغی: گــوڵ خــەندانــی، ئــەفعا: بـاغەبانی، تـیفلی دڵ
چـــوو لە بــۆ غــونچەی دەمـــی ڕەشــماری زولفـی پـێوەدا

(١) نووسرا بوو کێوو هەردەدا، وادیارە هەڵەیە چونکە وا جوانترە.
(٢) چێوە: چیلکەودار ـ نوعی چوب کە برای تنبیە کردن از آن استفادە می‌شود.
(٣) ڕەهزەن: رێ گر، چەتە (قاطع الطریق) ـ راهزن.

بۆ هەموو کەس خاوەن یەغما[۱] بوو، شەکەرخەندەی لەبی[۲]
بـــۆ مـــنی بـێ‌کـەس جـوێنی تـرش و تـاڵی تـێوەدا
(نـــاریا)خـــۆ تـــەرکی دنـــیا ئـــایەتی ئـازادی‌یـە
بـۆ گـرفتاری لە ـ بـیت الحـزن ـ ی ئـەم بـێ خـێوەدا[۳]

* * *

-۳-

ڕەفـــیقانم هـــەموو ڕۆیـــین لە دێ‌دا
بـە تـەنها هـەر ئـەمن مـاوم لە جـێ‌دا
لە بـــەر دنـــیا نـەما یـادی قـیامەت
خـودا چـی بکـەم لەمـێدا، یـا لەوێ‌دا
قـەزا ڕۆژێ شکـستی‌دا بـە مـەردان[۴]
کە بـەیداغـی جـیهانگیری بـە (مـێ)دا[۵]
کـە مـەنزڵ عـاریەت بـێ عـارە مـەیلی
خـەراری خـاری خـواری وا لە ڕێ‌دا
بەهەر کـەس تـا نـەدا نـەقدی هـەم و غـەم
بـەکـەس مـوشکیل، عـەزیزم! درهـەمێ‌دا

(۱) یەغما: تاڵان ـ غارت. (۲) لەب: لێو ـ لب.
(۳) بیت الحزن: مەبەست دنیایە ـ مقصود دنیای فانی است.
(۴) مەردان: پیاوان ـ مردان.
(۵) مێ: مەبەست (ڤیکتۆریا)ی شاژنی بەریتانیا بوو ـ مقصود ملکه ویکتوریا است.

کــەسێ دەرچــوو، لە داوی مـەکـری دنـیا

کـــە مـــەردانـــە تـــەڵاقی ســـێ بـە ســێدا

تەماشاکەن لە سفرە و خوانــی گـەردوون[١]

هـــەتا ســـەر نـــیعمەتی شـــادی بـە کـێدا!

بـە ســورەت ڕێ و زێ گـەرچــی یـەکـێکن

بـــەڕێ گــــەردی سـەفەر زیـبی بـەزێدا[٢]

بـەڵێ تـەقسیمی ئـوستادی ئـەزەل بـوو[٣]

بە (دۆڵاشی)ی خەلەو، ئاوی بە (نــێ)دا[٤]

ســـــەفەر مـــەولامە تـــا مـــاوم لەمـــەولا

کـە کـەوش و گـۆرەوی و تـۆزی بـە پـێدا

بـــە مـــیزانـی شـەریعەت سـەعبە (نـاری)

مــــەداراکـــــەی لە بـــەینی دوو هـــەوێدا

* * *

(١) گەردون: کەون. جیهان ـ جهان هستی.
(٢) زیبی بەزێدا: زیب: جوانی‌یە. لە هەمان کاتدا ئەو نـوختەیەی کـە لە سـەر (ز)یـە جوانی‌یە کە بۆ (ر) ـ جوانی و (شادکامی).
(٣) ئوستادی ئەزەل: خوا ـ أُستاد أَذل، خدا.
(٤) نێ و دۆڵاش: دوو گوندن لە مەریوان یەکەمیان بە خەلەو خەرمان بـە نـاوبانگە و دووەمیان بە ئاش و ئاو. دیسان ئاشی ئاو لە کوردستاندا کە باو بـووە ئـەوسا خـەڵە بـە دۆڵاشاو ئاویش بە (نێ)دا هاتوچۆی کردوە کە دووپارچەن لە بەشەکانی ئاش ـ دو منطقه از توابع شهرستان مریوان.

- ۴ -

فەلەک بۆ گەردوشی تـۆ لەحـزەیە تـەرکی جـەفا نـاکـا
بە قانونی ئەدەب شـەرمێ لە خـاسانی خـودا نـاکـا[(١)]
مەگەر ئەو مادەری شمری سەگو بو جـەهلی مـەلعوونە
کەوا قەت تەرکی غەم پێدانی (مـا تـحت العـبا) نـاکـا
بە تەرزی ئیبنو مەلجەم پارەبێ جەرگی کەوا ڕەحمێ[(٢)]
بـە ئـاهو سـۆزشی سـینەی حـەزینی مـورتەزا نـاکـا
یەقینم وایە توشنەی خوێنی ئەولادی موحەممەد بوو[(٣)]
کە قەت خۆفێ لە هـەنگامەی خـرۆشی کـەربەلا نـاکـا
بە بـێمیهری، بـەڵێ مـەشهووری ئـافاقە، فـەلەک بـۆیە
لە شـاهی ئـەنبیا شـەرمێ، لە فـرزەندەی حـەیا نـاکـا
دەسا با بێـینەوە سـەر واقـیعەی سـالاری دیـن پـەروەر
ئەگەرچی خامە عوشرێکیش لە عینوانی ئـەدا نـاکـا[(۴)]
حەفیدی حەزرەتی کـاک ئـەحمەدی قـوتبی سـلێمانی
کە بێ ئیمدادی فەیزی بەرگی گوڵ نەشئە و نوما نـاکـا
لە شاری موصلا وەسـلی بـە ئـەنواری شـەهادەت بـوو
بەڵێ ڕوتبەی شەهادەت، تەرکی ئـالی مـوصطفی نـاکـا

(١) بەڕێز شێخ سەعیدی حەفید لە ١٩١٠ز لە موصل کوژرا.
- شیخ بزرگوار سعید حفید در ١٩١٠ در موصل شهید شد.
(٢) ئیبنو مولجەم: عبدالرحمن کوڕی مولجەمە کە حەزرەتی عـەلی‌ی شـەهید کـرد و پارچە پارچەیان کرد - عبدالرحمان ابن ابن ملجم، فردی ناپاک بودە کە حضرت علی را شهید کرد.
(٣) توشنە: تینوو - تشنە.
(۴) خامە: پێنووس. قەڵەم - قلم.

حوسەین ئاسا لە مەوجی خوێندا پەیوەستە فەرموویە
دەسا بۆ کەس خەیاڵی (من سقانی، قدنجا) ناکا[١]
ئەگەر دابی موسڵمانی وەها بێ وەک لە موصڵدا
بە حوسنی دینی ئیسلامی، فەڕەنگی ئیعتینا ناکا
عیباداتی گرۆهی موددەعی بەد تینەت و عاسی[٢]
لە دیوانی جەزا بێشک بە قەد یەک جۆ بەها ناکا
مەگەر موصڵ بە ئاهی حەزرەتی ـ زەهرا ـ سەروبن بێ
وە ئیللا قەتڵی ئالی زەخمی ئەهلی دڵ دەوا ناکا
عەجەب ماوم لە سوککانی فەلەک، یەعنی مەلەک بۆچی؟
کە ئەمری تەعزیەی ئیسلامی ئەم میحنەت سەرا ناکا
کەسێ یەک زەڕڕە ئیمانی لە دڵ دابێ بە ئیمانم
قبووڵی بوردەباری زیللەتی ئەم ماجەرا ناکا[٣]
نەماوە ئابڕوو بۆ ئەهلی گوڵ عەنبەر لە عالەمدا[٤]
بە بێ شک جوو لە مەولاوە لە قوتبیش مەرحەبا ناکا
سلێمانی بەبێ ـ نی ـ واقیعەن تەسغیری سەلمایە[٥]
کە ئەهلی وەک زەعیفەی بێ هونەر مەیلی غەزا ناکا

(١) من سقانی قد نجا: ئەوی ئاوی دام رزگاری بوو ـ کسی به من آب داد رستگار شد.
(٢) گرۆه: کۆمەڵ ـ اجتماع. (٣) بوردەبار: ئارام و ئۆقرە ـ صبور.
(٤) گوڵ عەنبەر: هەموو ناوچەی شارەزووری جاران کە پایتەختەکەی خورماڵ بوو ـ تمام سرزمین شهرەزور قدیم که مرکز آن خُرمال بوده است.
(٥) واتە سلێمانی بەبێ (نی) سلیمایە کە بچووک کراوەی (سەلما)یە ـ اسم مصغّر سلیمانی که ابتدا سلما و سپس سلیما بوده است.

